


# بڵاوبوونەوەی داوێنپیسی

زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی

# بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی

## هۆکارو دەرئەنجامەکانی

نوسینی

مامۆستا حەمزە بەرزنجی



# بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی

کـــتـــێـــبـــــــی: بڵاوبوونەوەی داوێنپیسی

نوسینـــــــــــــی: م. حمزە بەرزنجی

نەخشەســـــــازی: ئیــسـلامڕەوە

ساڵـــــــــــــی: ١٤٣٧ك-٢٠١٦ز



لە بڵاوکراوەکانی بنکەی دیدی نوێ

لقی: دەرەوە

وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى

إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً

...................... الاسراء ٣٢ ................

بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيِرَاً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيبَاً

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديدَاً، يُصْلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزَاً عَظيماً

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتِها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالَةٍ في النَّارِ.



## دەستپێك

لـــەم ســـەردەمی پـــڕ لەگومڕاییـــەدا هـــەموو دەرگــا یـــەکی داوێـــن پیســـی و فاحیشـــە خراونەتـــە ســـەر پشـــت، شـــەیتانەکان ســـەرجەم رێگاکـــانی بـــۆ ئابڕوییـــان ئاســـان کـــردووە، بۆیـــە دەبیـــنی هۆکارەکـــانی کەوتنـــە نـــاو داوی خراپـــەکاری ئاســـان و هەرزانن.

ســـفوری و لاشـــەی خـــۆ دەرخســـتن بـــەخۆڕایی، نـــەزەرو چـــاو نـــەگرتن، تـــێکەڵاوی نێرومـــێ لـــە هـــەموو فەرمانگـــەو شـــوێنە گشـــتییەکاندا، زۆربـــوونی گۆڤـــاری سێکســـی، فیلـــمی ئـــارەزوو بـــزوێن و هەڵخەڵەتێنـــەر، دامـــو دەزگـــاو راگەیانـــدنی دوور لـــە رەوشـــتی ئیســـلامەتی و کوردایـــەتی، ســـەفەرکردن بـــۆ وولاتـــانی پـــڕ لـــە ئیلحـــادو لـــەش فرۆشـــی و پـــڕ لـــە بـــازاڕی ســـۆزانییەکان، خـــۆ چوانـــدن بـــە گـــاورو جولەکـــەو لاســـایی کردنـــەوەی کوێرانـــەیان والابـــوونی بـــارو مـــەی فرۆشـــەکان، هـــەرزانی گشـــت جۆرەکـــانی مەشـــروبات مـــادە بـــۆ هۆشـــکەرەکان، بـــە ئاشـــکرا بانگەشـــە کـــردن بـــۆ بـــەرەڵا کردنـــی ئافرەتـــان وتێکـــدانی شـــیرازەی خـــێزان لـــە لایـــەن رێکخـــراوی بـــەناو ئافرەتـــان و ژنانـــەوە، والابـــوونی ســـنوورەکان بـــە رووی گەشـــتیارانی بیـــانی، گـــران بـــوونی خـــانووی کـــرێ و قوورســـی کـــاری ژن هێنـــان لـــەلای گەنجەکانمان.. وەچەندان هۆکاری تر.

هـــەر لەبـــەر ئەمەشـــە دەبیـــنی وولاتمـــان پـــڕە لـــە دیـــاردەی لـــەش فرۆشـــی ئاشـــکراو ژێـــر بـــەژێر بـــە تایبـــەتی لـــە ســـەیرانگاکان و

لاپـــەڕی شــــارەکانداو دەرکـــەوتنی کۆرپـــەی زۆڵـــی فـــڕێ دراوو بڵاونەوی هەواڵی دەرکەوتنی نەخۆشی (ئایدز).!!

لەبەرامبەریشــــدا سســـــتی موســــڵمانان و راگەیانـــدن و بانگـــەوازی ئیســــلامی و چــۆڵ پــێ کردنــی مزگەوتـــەکان و نەهێشــــتنی وانــــەی پــــەروەردەیی و ئیمـــانی و بـــێ ئاگـــایی مامۆســـتایانی ئـــایینی لـــەم مەســـەلەیە یـــان ترســـان و بـــاس نـــەکردنی. گەنجـــەکانمان لـــە جیاتی ســـەرقاڵ بـــوون بـــە بەهرەیـــەکی ســــوودمەندو زانســــتیانە گرفتـــارن بـــە چەنـــدین نەخۆشـــی دەرونـــی و خـــەریکی فەوتانـــدنی کاتـــەکانیان بـــە شـــتی بێ سوودو بێ بەهاوە.

کـــوفریش لەبەرامبـــەردا شـــەوو رۆژ لەبەرنامەدایـــە تـــا ڕێگاکـــانی بـــەرەو دۆزەخ بـــردن لــــەلای مشــــتەریيەکانی جـــوانتر بڕازێنێتـــەوەو هەوڵـــدەدات کـــە بـــە تـــەنها خـــۆی نـــەبێت بـــە ســــووتەمەنی دۆزەخ و بـــەس لەخـــەمی ئەوەدایـــە بــــازاڕی شەرواڵ پیسان و پێڕی خوانەناسان زیاترو زیاتر بکات.

لـــەو دیـــاردە ســـامناکانەش کـــە لـــە دەرەنجـــامی ئەمـــەوە دەرکـــەوتووە (زینـــاو نێربازی)یـــە.. جـــا لەگـــەڵم بـــەو هەســـتت بێداربکـــەرەوەو دەســـتم بـــدەرێ و هێـــواش و لەســـەرخۆ ئـــەم نامیلکـــە دیارییـــە بـــەووردی بیخوێنـــەرەوەو بزانـــە ســـەرەنجام بەکوێ دەگات.

ئەی نەفس بۆ هەوەس ملم مەشکێنە

ڕێـی ڕاســـــتی ژینم لێ مەشـێوێنە

بۆتەنـــها خۆشی چەند ساتێکی کـەم

خـــــــالقی کەونم لــێ مەڕەنجێـنە

## پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئوممەتەکەی لەم تاوانە ئاگادار کردۆتەوە

عَـنْ عَبْـدِ اللَّهِ بْـنِ عُمَـرَ قَـالَ أَقْبَـلَ عَلَيْنَـا رَسُـولُ اللَّهِ فَقَـالَ: (يَـا مَعْشَـرَ الْمُهَـاجِرِينَ خَمْـسٌ إِذَا ابْتُلِيـتُمْ بِهِـنَّ وَأَعُـوذُ بِـاللَّهِ أَنْ تُـدْرِكُوهُنَّ لَـمْ تَظْهَـرْ الْفَاحِشَــةُ فِـي قَــوْمٍ قَــطُّ حَــتَّى يُعْلِنُــوا بِهَــا إِلَّا فَشَــا فِــيهِمْ الطَّــاعُونُ وَالْأَوْجَــاعُ الَّــتِي لَــمْ تَكُــنْ مَضَــتْ فِي أَسْـلَافِهِمْ الَّــذِينَ مَضَــوْا......)[1] واتـە: ئـەی کۆچـەرییەکان پێـنج خـاڵ هـەن ئەگـەر تووشـی بـبن،( پـەنا ئـەگرم بەخواکـە تووشـی بـبن): هــەرکاتێك داوێـن پیسـی لـە هــەر گەلێکــدا دەرکــەوێت و بــە ئاشــکرا ئــەنجامی بــدەن ئــیلا طــاعون و دەردو نەخۆشـی سـامناکی وا تیایانـدا بڵاودەبێتـەوە کـە لـە پـێش ئەوانـدا لـە باوو باپیرانیاندا دەرنەکەوتووە.

جـا ئەگـەر بـە ووردی تەماشـای ئـەو نەخۆشـیە سـامناکانە بکـەین کـە لـە داوێـن پیسـیەوە بـڵاو دەبێتـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە لـە کۆتـایی سەدەی رابووردودا دەرکەوتووەو پێشتر نەبووە..



[1] رواه ابن ماجة وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة(١٠٦).

# دەرەنجامە شومەکانی داوێن پیسی (زینا)

خوای کاربەجێ دەفەرموێت: (وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً)[1] واتە: نزیکی زیناو داوێن پیسی مەکەونەوەو هەنگاوەکانی کەوتنە ناو ئەو گوناهە مەگرنەبەر بەڕاستی زینا گوناهێکی گەورەو ڕێگایەکی بەدو پیسە، جا لەو دەرەنجام و ڕێگا پیسانەی لەم بەدکارییەوە سەرهەڵدەدەن ئەمانەن:

١. پیس بوونی ناموس و نەمانی دروشمی داوێن پاکی لەناو کۆمەڵگادا.
٢. بەرگی ریسوایی و سەرشۆڕی لەناو خەڵکیدا دەکرێتە بەری زیناکار.
٣. زینا دڵ نەخۆش دەخات ئەگەر نەیمرێنێ.
٤. زینا شیرازەی خێزان تێك دەدات و پەیوەندی نێوان ژن و مێرد دەپچڕێنی و منداڵەکانیشیان تووشی بێ پەروەردەیی و بەرەڵایی دەبن.
٥. پشتو وەچە بەهۆی ئەم کارە گڵاوەوە نامێنێ و تێکەڵ دەبێت و (زۆڵ)ی پێ نەزانراو زۆر دەبێت و کەس نازانێ باوکو باپیری کێیە.
٦. زینا پەیوەندییەکی کاتی ئارەزووبازیانەیەو هیچ بەرپرسیارێتییەکی لەدواوە نیە. جا بەو پێیە کارێکی

[1] الاسراء/٣٢

ئاژەڵیانەی رووتە چونکە ئەوەندە پێویستیان بە یەکترییە تا ئارەزووەکەیان تێر دەکەن.

٧. زینا هۆکارێکە بۆدرووست بوونی کوشتن (قتل) لەناو کۆمەڵگادا. بەوەی کەس و کاری ئافرەت یان کوڕەکە بەکوشتن کێشەکە یەکلادەکەنەوە تا ئەو شەرمەزارییە لەسەر بنەماڵەکەیان لابەرن.

٨. زینا شێرازەی کۆمەڵگا دەشێوێنێ و منداڵی زۆڵی فرێ دراوی تێدا زۆر دەکات. پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت:(لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يَفْشُ فِيهِمْ وَلَدُ الزِّنَا، فَإِذَا فَشَا فِيهِمْ وَلَدُ الزِّنَا، فَيُوشِكُ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِعِقَابٍ)[١] واتە: ئوممەتەکەی من خێری تێدا ماوە مادام منداڵی زۆڵی تێدا دەرنەکەوێت. جا هەر کاتێك منداڵی زۆڵی تێدا دەرکەوت ئەوە نزیکە کە خوای گەورە سزایەکی گشتیان بۆ بنێرێت.

٩. زینا دەبێتە هۆی خەم و خەفەت و ترس و دڵەراوکێ، کەسی زیناکار لەنێوان چەند دوو حاڵەتدا دەهێڵێتەوە. یان مانەوە بەو حاڵەتە سەرشۆڕییەوە، یان کوشتنی ئەو منداڵەی لەو حاڵەتەوە پەیدا بووە.

---

[١] رواه أحمد وأبو يعلى والطبراني بسند صحيح.

١٠. زینا یەکێکە لە فیتنەو نیشانەکانی تێك چوونی بوونەوەرو نزیك بوونەوەی قیامەت.

١١. زینا هۆکارێکی راستەوخۆیە بۆ تووش بوون بەو نەخۆشیە سامناکانەی کە لاشە لەیەك هەڵدەوەشێنێ و بەویراسەت لە باوك و دایکەوە بۆ منداڵ دەگوێزرێتەوە.

١٢. زینا هۆی خەشم و تووڕەیی خوای گەورەیە. ابن مەسعود خوای لێ رازی بێت دەفەرموێت: (مَا ظَهَرَ فِي قَوْمٍ الزِّنَا وَالرِّبَا إِلا أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عِقَابَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)[١] واتە: زینا لە هیچ کۆمەڵگایەکدا دەرنەکەوتووە ئیلا بە دەستی خۆیان سزاو تۆڵەی خوای گەورە بۆ خۆیان حەڵاڵ دەکەن.



[١] رواه أحمد بسند صحيح وأبو يعلى.

# ئاژەڵانیش ئەم کارە ڕەت دەکەنەوە

ذكــر البخــاري فــي صــحيحه عــن عمــرو بــن ميمــون الاودى قــال: (رَأَيْــتُ فِــي الجَاهِلِيَّــةِ قِــرْدًا زِّنَــى بقِــرَدَةً فَــاجْتَمَعَ الْقُــرُودَ عَلَيْهِمَــا فَرَجَمُوهَــا حَــتَّى ماتــا). واتــە: عــەمروی کــوڕی مــەیمونی ئــەودی دەفــەرموێت: لــە نەفامێتــدا نــێرە مــەیمونێکم بیــنی زینــای لەگــەڵ مــەیمونێکی مێیــەدا کــرد. جــا مەیمونــەکان لێیــان کۆبوونەوەو بەردەبارانیان کردن تا مرداربوونەوە !!

لــەناو گیانلەبەرانــدا ئەمــە زۆر بــە ئاشــکرا دیــارە کــە هــیچ نێرەیەك ڕێ نادات نێرەیەکی تر نزیکی مێیەکەی بێتەوە.

بەڵام بــەلای ڕۆژئــاواوە زینــا تــاوان نییــەو ئەگــەر گــەنجێك لەگــەڵ ئافرەتێکــدا زینــا بکــات ئــەوا خراپەیــەکیان نــەکردووە شایســتەی ســزا بێــت مەگــەر بــەزۆر زینــای لەگــەڵ کردبێــت!! ئــەو کاتــەش ســزایەکی مــادی ســووك دەدرێــت! خــۆ ئەگــەر زینــای لەگــەڵ ژنــی کابرایەکــدا کردبێــت ئــەوای مــێردی ژنەکــە تەنها بۆی هەیە داوای تەعویزێکی مادی بکات و بەس!!!



## زینا قەرزێکەو دەبێ بیدەیتەوە

ئەگێڕنــــەوە کابرایـــەکی ئـــاوگێڕ لەشـــاری (بوخـــارا)دا مـــاوەی ســـی ســـاڵ ئـــاوی دەبـــرد بـــۆ مـــاڵی کابرایـــەکی زێڕەنگـــەرو (ســـەقا) یـــان بـــوو. ئـــەو زێڕەنگـــەرەش ژنێکـــی جـــوانی هـــەبوو. رۆژێکیـــان وەك عـــادەتی خـــۆی کـــاتێ کـــابرای ئـــاوگێڕ چـــوو بـــۆ ماڵیـــان دەســـتی ئافرەتەکـــەی گرتـــو گوشـــی! جاکـــاتێ مێردەکـــەی لـــەبازاڕ گەڕایـــەوە ژنەکـــــە پـــــێی وت: پیاوەکـــــە ئـــــەمڕۆ لـــــەدوکان چ کارێکـــــت ئەنجامـــــداوە خـــــوای گـــــەورە پـــــێی رازی نـــــەبێت؟ وتـــــی: هـــــیچم نـــەکردووە. ئـــەویش زۆری لـــێ کـــرد تـــا بـــۆی گێڕایـــەوەو وتـــی: ئـــەمڕۆ ئافرەتێـــك هـــات بـــۆ دوکانەکـــەم و منـــیش بـــازنێکم دایـــەو تـــاقیم کـــردەوەو کردمـــە دەســـتی. وە دەســـتی زۆر ســـپی بـــوو منـــیش گوشـــیم! ژنەکـــەی وتـــی: الله اکـــبر. ئەمـــە حیکمـــەت و هـــۆی کـــردەوەی ئـــەو ئـــاوگێڕەبوو کـــە ئـــەمڕۆ کـــردی. مێردەکـــەی وتـــی: ئـــافرەت مـــن پەشـــیمان دەبمـــەوەو تەوبـــە دەکـــەم و گـــەردنم ئـــازاد بکـــە. بـــۆ ســـبەینێ گەنجـــە ئاوهێنەکـــە هـــاتو وتـــی: ئـــەی ئـــافرەتی خـــاوەن مـــاڵ گـــەردنم ئـــازاد بکـــە بەڕاســـتی دوێـــنێ شـــەیتان گـــومڕای کـــردم. ئـــەویش ووتـــی: بـــڕۆ خەتاکـــە خـــەتای ئـــەو پیـــاوە بـــوو کـــە لەدوکانەکەدایـــە (واتـــە مێردەکـــەی) چونکـــە کـــاتێ حـــاڵی خـــۆی گـــۆڕی بـــەوەی دەســـتی ئـــافرەتێکی بێگانـــەی گوشـــی، خـــوای گـــەورەش حـــاڵی خێزانەکـــەی گـــۆڕی بـــەوەی بێگانەیـــەك دەســـتی ژنەکەی گوشی.[1]

وەلە نموونەی ئەم بەسەرهاتە زۆرەو لەژمارە نایەت.

---

[1] تفسير روح البيان للبروسوی.

# حەددی زینا لە شەرعی خوای گەورەدا

خـــوای پـــەروەردگارو کاربەجێســـێ ســـزای قورســـی بـــۆ ئەنجامدەری ئەم کارە گڵاوە داناوە:

یـەکـەم: کوشـتن بـە قورسـترین شـێوە (ئەگـەر شـوی کردبـوو یـان ژنـی هێنـابوو)، وەلێـدانی سـەد دار (ئەگـەر شـوی نـەکردبوو یـان ژنـی نـەهێنابوو) وەسـاڵێك دوورخسـتنەوی لـەووڵاتی خـۆی: لـە بوخـاری و موسـلیمدا هـاتووە: ئەعرابیـەك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ و فـەرموی: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، کوڕەکـەی مـن بـەکرێ گرتـە بـووە لای ئـەم کابرایـەو زینـای لەگـەڵ ژنەکەیـدا کـردووە، منـیش بیسـتوومە کـەوا دەبێـت کوڕەکـەم رەجـم بکرێـت، جـا سـەد سـەر مـەڕم کـردووە بـە فیدیـەی لەگـەڵ کەنیزەیەکـدا، دوایـی پرسـیارم کـرد لـە ئـەهلی عـیلم ئـەوان پێیـان راگەیانـدنم کـە دەبێـت کوڕەکـەم سـەد داری لێبـدرێت و سـاڵێك دووربخرێتـەوەو ئـەو ژنـەش دەبێـت رەجـم بکرێـت؟ (واتە جا کامیان بکەم).

پێغەمبـەریش صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فـەرمووی: (وَالَّـذِي نَفْسِـي بِيَـدِهِ لأَقْضِـيَنَّ بَيْنَكُمَـا بِكِتَـابِ اللَّهِ، الْمِائَـةُ شَـاةٍ وَالْخَـادِمُ رَدٌّ عَلَيْـكَ، وَعَـلَى ابْنِـكَ جَلْـدُ مِائَـةٍ وَتَغْرِيـبُ عَـامٍ، وَاغْـدُ يَـا أُنَـيْسُ عَلَـى امْـرَأَةِ هَـذَا فَـإِنِ اعْتَرَفَـتْ فَارْجُمْهَـا فَغَـدَا عَلَيْهَـا فَاعْتَرَفَـتْ

فَرَجَمَهَا). واتە: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە بەپێی قورئانی خواحوکمتان دەکەم،کە نیزەك و مەرەکان دەدرێتەوە پێت و وەرناگیرێت. وە کوڕەکەت سەد داری لێ دەدرێت و ساڵێك دوور دەخرێتەوە، وە ئەی (ئونەیس) بەیانی بچۆ بۆ لای ژنی ئەو پیاوە ئەگەر دانی نا بەزیناکەدا رەجمی بکە. جا کە چوو بۆ لای ژنەکە دانی پێدانا، پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانی پێکردو رەجم کرا.

دووەم: خوای پەروەردگار نەهی کردووە لە ئیمانداران کە لەکاتی ئەنجامدانی ئەو حەددەدا سۆزو بەزەییان هەبێت بۆی و وازی لێ بهێنن یان سووکی بکەن وەك دەفەرموێت: (.. وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ..)[1] واتە: وە با بەزەیی نەتان گرێتەوە لە جێبەجێکردنی حوکمی خوادا ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو رۆژی دوایی هەیە.

سێیەم: وە دەبێت ئەنجامدانی ئەم حەددە بە بەرچاوی کۆمەڵێك ئیماندارەوە بکرێت. وەك دەفەرموێت: (..وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ)[2] واتە: با کۆمەڵێك لە ئیمانداران ئامادەی ئەم سزادانە بن و بیبینن.

---

[1] سورەتی نور/٢

[2] سورەتی نور/٢

جا ئازار و ژانی ئەم سزایە سەرجەم ئەندامەکانی لاشە دەگرێتەوە هەروەك چۆن لە ئەنجامدانی زیناکەدا هەموو ئەندامەکانی چێژی لێ وەرگرتووە. جگە لەوەش سزایەکی دەروونی قورسە چونکی خەڵکی تەماشای دەکەن و بۆ ئەوانیش سوودی زۆری تێدایە کە ریسوایی شەروال پیسی بەکرداری دەبینین.



# گەورەترین جۆری زینا

گەورەترین زینا ئەوەیە لەگەڵ دراوسێدا ئەنجام بدرێت، یان لەگەڵ ئافرەتێکی خاوەن مێردا. یان لەگەڵ ناسیاوو خزمی خۆیدا. یاخود دراوسێ و خزمیشی بێت، یان لەگەڵ خێزانی موجاهیدێکدا کە رۆیشتبێ بۆ جیهاد، یاخود لەکات و شوێن و شارێکی پیرۆزدا زینا بکات، یاخود کەسێك لەگەڵ خێزانی خۆیدا دوای ئەوەی تەڵاقی تەواوی داوەو گوێ ناداتە شەرع و کاری سەرجێیی لەگەڵ دەکات..

وەیەکێك لە هەرە زینا گەورەکان زیناکردنە لەگەڵ مەحرەم دا (واتە لەگەڵ کەسێکی نزیکی خۆی کە بە هەمیشەیی بۆی دروست نییە مارەی بکات وەك: دایکو، خوشك، پور، نەنك..) ئیبن عەباس خوای لێ رازی بێت دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (مَنْ وَقَعَ عَلى ذَاتِ مَحْرَمٍ، فاقْتُلُوه)[1] واتە: هەر کەسێك زینای لەگەڵ مەحرەمێکی خۆیدا کرد بیکوژن.

وە لەسەردەمی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیدا کابرایەکیان هێنا زینای لەگەڵ خوشکی خۆیدا کردبوو بە زۆر. حەجاجیش ووتی: بەندی بکەن و پرسیار لە هاوەڵێکی

---

[1] اخرجة ابن ماجة (٢٥٦٤) في الحدود وفي سندة ابراهيم بن اسماعيل بن ابي حبيبة الانصاري وهو ضعيف لكن يشهد له حديث ابن أبي خيثمة في تأريخه من حديث معاوية بن قرة عن أبيه عن جده(ﷺ). أن رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بعثة الى رجل أعرس بأمراة ابيه فضرب عنقه وخمس ماله) قال يحيى بن معين: هذا حديث صحيح.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەن لێرەدا. ئەوانیش پرسیاریان لە عبدالله کوڕی مطرف کرد ئەویش فەرمووی: بیستوومە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی:(مَنْ تَخَطّى حَرَمَ الْمُؤْمِنِينَ فَخُطّوا وَسَطَهُ بِالسّيْفِ) [1] واتە: هەرکەسێك حەرام کراوەکانی ئیماندارانی شکاند ئەوا بە شمشێر لەناو قەدی بدەن .

جا سەرجەم زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوەی حەددی لەسەرە بەڵام جیاوازن لە چۆنێتی حەددەکەدا کە ئایا کوشتنە یان حەددی زینایە.[2]



[1] أوردة الهيثمي في المجمع ٢٦٩/٦ وقال:رواه الطبراني وفيه رفدة بن قضاعة. وثقة هشام بن عمار وضعفه الجمهور.

[2] الجواب الكافى ص ١٩٩-٢٠٠.



# نێربازی

خــوای گــەورە دەربــارەی گــەلی قــەومی (لــوط) پێغەمبــەر علــیه الصــلاة والســلام لــە ســەرزمانی پێغەمبەرەکــەیان دەفــەرموێت: (أَتَـأْتُونَ الـذُّكْرَانَ مِـنَ الْعَـالَمِينَ * وَتَـذَرُونَ مَـا خَلَـقَ لَكُـمْ رَبُّكُـمْ مِـنْ أَزْوَاجِكُـمْ بَـلْ أَنْـتُمْ قَـوْمٌ عَـادُونَ)[1] واتــە: ئایــا ئێــوە خراپــەو نێربــازی لەگــەڵ نێرینەکانــدا دەکــەن و واز لەچوونــە لای ئــەو خێزانانــەتان دەهێـنن کــە خــوای گــەورە دروســتی کــردووە بۆتــان بەڕاســتی ئێــوە گەلێکی سنور بەزێن و رۆچوون.

خــوای پــەروەردگار نــاوی زینــا دەبــات بــە (فاحشــة) بەڵام نێربــازی نــاو دەنــێ بــە (الفاحشــة) واتــە: ئــەو کردەوەیــەی پیســی و گــڵاوی تێــدا کۆبۆتەوەو بەلای هەموو کەسێکەوە کارێکی قێزەونە.

موجاهیــد دەفــەرموێت: (ئــەو کەســەی ئــەو کــارە ئــەنجام دەدات ئەگــەر بــە هــەموو دڵۆپــە بــارانێکی ئاســمان و هــەموو دڵۆپە ئاوێکی زەوی خۆی بشوات هەر پیسەو پاك نابێتەوە).

فضــیلی کــوڕی عیــاض دەفــەرموێت: (ئەگــەر نێربازێــك بــە هــەموو دڵۆپــە ئــاوێکی ئاســمان خــۆی بشــوات ئــەوا هــەر بــە پیســی دەگــات بــەخوای گــەورەو لــەو گوناهــە پــاك نابێتــەوە) اسناده حسن. روح المعانی للالوسی ١٧٢/٨.

---

[1] الشعراء:١٦٥-١٦٦

# سیفەتی مرۆڤی نێرباز

١. فیترەتیان شێواوەو لایانداوە لە سیفەتی ئینسانی خۆیان کە خوای گەورە لەسەری خەلقی کردوون. کە ئەویش ئارەزووکردنی مێینەیە نەك نێرینە.

٢. چێژ بەسەربردنیان لەسەر پیسترین شوێن و قێزەون ترین جێگایە.

٣. لەخوار ئاژەڵەوەن لەشەرم و سروشت و غەریزەدا. چونکە ئاژەڵ هەرگیزو هەرگیز نێرەیان نزیکی نێرە نابێتەوە.

٤. هەمیشە لەبیری خراپەدان لەکاتی بینینی نێرە یان مێیە، بچووك یان گەورە.

٥. بێ شەرمن چونکە زەوی ئاوی شەرمی لێ مژیون و شەرم لەکەس ناکەن.

٦. لاشەو ئیرادە لاوازن.

٧. خوای گەورە گەلی (لوط)ی ناوبردووە بە (فاسقین) لەرێ دەرچووان (مسرفون) رۆچووان (مفسدین) خراپەکارو تێکدەران (ظالمين) ستەمکاران.

عبدالله کوری مەروان دەفەرموێت: ئەگەر خوای گەورە باسی گەلی لوط پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ی نەکردایە لە قورئاندا. گومانم نەدەبرد کەسێك هەبێت ئەو کارە پیسە بکات.

# سزای گەلەکەی لوط پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام

خوای گەورە دەفەرموێت: (فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ)[1] واتە: کاتێ فەرمانی بە هیلاك بردنی ئێمەیان بۆهات ژێرەو زەبەرمان کردن و زەویمان بەرزکردەوەو دامانەوە بەسەریاندا، وە بەرد بارانمان کردن بە بەردی قوڕی سورکراوەو بەلێزمە دەباری بەسەریاندا، ناوی هەریەکەیانی لەسەر نووسرابوو. ئەم سزایە دوورنییە تووشی ستەمکارانی تریش ببێتەوە وەك ئەوان ئەگەر هەمان تاوانیان ئەنجامدا.

بەردبارانکردنیان بەجۆرێك هەموویانی گرتەوە بازرگانێك چوو بوو بۆ حەرەم، ئەو بەردەی ناوی ئەوی لەسەر بوو (٤٠) رۆژ وەستا تا کابرا گەڕایەوە لەسەفەرەکەی و بەردەکەی بەرکەوتو کوشتی[2]..

کەواتە سزاکەیان بریتی بوو لە تیاچوون و هەڵگێڕانەوەی زەوی بەسەریانداو رۆچوون و بەردباران کردنیان و ریسوابوون.

---

[1] سورەتی هود/٨٢

[2] روح المعانی للالوسی ١٧٢/٨.

## سزاو حەددی نێرباز لە شەریعەتی خوای گەورەدا

ئیمامی ئیبن قەیم (رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت) نەقڵی کردووە کە سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەر ئەوەن کە دەبێت ئەو کەسەی ئەم کارە دەکات بکوژرێت، بەڵام لە چۆنێتی و شێوازی کوشتنەکەیدا جیاوازن. حەنبەلییەکان ئیجماعی هاوەڵانیان هێناوە لەسەر ئەوەی حەددی نێرباز کوشتنە، بە بەڵگەی فەرموودەی: (مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ)[1]. واتە: هەرکەسێکتان بینی ئەو کارە پیسەی گەلی لوط ی دەکرد ئەوا بکەرو لێکراو بکوژن.

وە بەڵگەی ئەوەی ئیمامی علی (خوای لێ رازی بێت) بەردبارانی کەسێکی کردوە کە ئەم کارەی کردووە. ئیمامی شافعی دەفەرموێت: ئێمەش ئەو رایە دەگرین کە هەرکەسێك ئەم کارە بکات ژن هێنەرو شووکردوو بێت یان نا ئەوا رەجم دەکرێت.

---

[1] رواه الترمذي(١٤٨١/٨/٣) وأبوداودوابن ماجه وهو حديث صحيح.أنظر صحيح ابن ماجه(٢٠٧٥) والارواء(٢٣٥٠).

هەروەها لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە گێڕدراوەتەوە کەوا رۆژێکیان لەناو رێگایەکدا کابرایەکی بینی نێربازی لەگەڵ دەکرێت، ئەویش نامەی نارد بۆ ئەبوبەکری سدیق و ئەویش راوێژی بە هاوەڵانی کرد تا چی لێ بکرێت. جا وتەی ئیمامی عەلی لە هەمووان توند تر بوو فەرموی: تەنها یەك نەتەوە ئەم کارەی کردووەو دەشزانن خوای گەورە چی بەسەر هێنان. من وا دەبینم دەبێ بە ئاگر بسوتێنرێت. جا ئەبوبەکریش نامەی نارد بۆ خالیدو سوتانیان.

عبدالله کوڕی عەباس دەفەرمووێت: دەبرێتە سەر بەرزترین جێگاو بینای ئەو شارو لادێیەو لەوێوە بەپشتا فڕێ دەدرێتە خوارەوە. پاشان بەرد باران دەکرێت.

جا هەریەکەو رایەکی هەیە لەسەر کوشتنی جا بەسوتاندن یان بەردباران کردن یان بەردانەوەو بەردباران کردن یان مل پەڕاندن یان دیوار روخاندن بەسەریدا.



## ئەو نەخۆشیە سامناکانەی کە لە دەرەئەنجامی داوێن پیسییەوە پەیدا دەبن

١. ئایدز: ئەم نەخۆشییە بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٩٨١ز لەئەفەریقا دەرکەوتووە.ئایدز (AIDS) ناوێکی ئینگلیزییەو کورتکراوەی ئەم ووشەیەیە: Acquired Immuno Deficiency Syndromeواتە: لە کەمبوونەوەی توانای کرداری بەرەنگاری و پارێزگاری لە لاشەدا. ئەویش لە ڕێگای ڤایرۆسێکەوە پێی دەوترێت (H.I.V) ئەم ڤایرۆسە پەلاماری خانەکانی سیستەمی بەرگری لاشە دەدات و پەکیان دەخات. ئەم ڤایرۆسە دەچێتە شلەی لاشە بەتایبەتی خوێن و مەنی، وە ڕێگاکانی گواستنەوەشی لە کەسێکی تووش بووەوە بۆ کەسێکی لەش ساغ بەهۆی: پەیوەندی سێکسی ناشەرعی نێوان نێرو نێر یان نێرو مێ، وە بەرکارهێنانی دەرزی بەکارهاتوو و ڤایرۆساوی بوو بەم نەخۆشییە. وەتێکردنی خوێنی کەسێکی تووش بوو. هەروەها لەدایکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کۆرپەکەی لەکاتی سك پڕی یان لەکاتی لەدایك بوون یان لەدوای لەدایك بوون.

ڤایرۆسی ئەم نەخۆشییە هیچ جیاوازییەك ناکات لە نێوان نێرو مێ، هەژارو دەوڵەمەند. تا ئێستا زیاد لە (٤٠) ملیۆن کەس لە جیهاندا تووشی ئەم نەخۆشییە بوون.ئەوەی جێگەی مەترسییە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بۆ ماوەی

چەنـد سـاڵێك دەرناكـەوێت و كەسـی تـووش بـوو هەسـتی پـێ ناكـات تـا بـە تـەواوی جێگـەی خۆیـان داگیـر دەكـەن!!! وە هـەتا ئێسـتاش لـە گـەڵ ئـەو هـەموو پێشـكەوتنەی جیهـان بـە خۆیـەوە بینیـوە لـە بـواری نوشـداریدا هـیچ چارەسـەرێك بـۆ ئـەم نەخۆشـیە نەدۆزراوەتـەوەو تاكـە چارەسـەر خۆپاراسـتن و داوێـن پاكێتییـە. سـەرەنجامی ئـەم نەخۆشـیەش مـەرگی حەتمییە.

٢. الزهـری: ئـەمیش یەكێكـە لـە نەخۆشـییە سـامناكەكان كـە لـەداوێن پیسـییەوە پەیـدا دەبێـت، سـەرەتا بـە چەنـد برینێكـی بچـووك و هـەوكردن دەسـت پـێ دەكـات كـە لـە دەوری دەمـدا دەردەكـەوێت و تەشـەنە دەكـات بـۆ هـەموو لاشـە، وە دەگاتـە جگـەرو دەبێتـە وەرەم و شـێرپەنجەو دەگاتـە بڕبـڕەی پشـت و دەبێتـە هـۆی شـەلەلی هەمیشـەیی، وە دەگاتـە ئەعصـاب و دەبێتـە هـۆی لـەرزۆكی بـەردەوام وەسـەرەنجام دەگاتـە سـی و دڵ و دەیكوژێت.

٣. الهربـز (هربـز جینتـالس): ئـەویش هۆكارەكـەی داوێـن پیسـیەو تووشـی كۆئەنـدامی زاوزێـی هـەردوو رەگـەزی نێرومـێ دەبێـت بەشـێوەی بـرین و بڵقـی گـەورە كـە بەردەوام ئازاری زۆری لەگەڵدایە.

٤. السـیلان: تووشـی كۆئەنـدامی مـیزو زاوزێ دەبێـت و ئـەم نەخۆشـییەش لـە ڕێـی نێربـازی و زینـاوە بڵاودەبێتـەوە. وە لـە مێیـەوە بـۆ مـێ دەگوازرێتـەوە بەڵام

مێیــــە درەنــــگ پــــێی دەزانێــــت بــــەهۆی سروشــــتی فیسیۆلۆجیەوە لە حەیزو شتی تر.

بەڵام نــــێر زوو هەســــت بــــە ئیلتیهــــابی داوێــــنی دەکــــات و ئیفرازاتــــی بۆگــــەنی لــــێ دەردێــــت و دەســــوتێتەوە. وە بــــۆنێکی زۆر ناخۆشــــی هەیــــە، ئەگــــەر زوو چارەســــەر نــــەکرێت و دوورنەکەوێتــــەوە لــــەو کــــارە داوێــــن پیســــیانە ئــــەوا میکرۆبەکــــە دەگاتــــە پرۆســــتات و گــــون و بــــۆری مــــیزو تەســــکی دەکاتــــەوەو زیــــان بــــە کۆئەنــــدامی مــــیز دەگەیــــەنێ و ئــــەو کــــات پێویســــت دەکــــات نەشــــتەرگەری بــــۆ بکرێــــت کــــە زۆربــــەی جــــار ســــەرکەوتوو نــــابێ و جگــــە لــــەوەش تووشــــی نــــەزۆکی دەکــــات. وە لــــە مێیــــەدا توشــــی کۆرپەکــــەی دەبێــــت لــــەکاتی لــــەدایك بوونــــدا.. وەکــــار لــــە هێلکــــەدان و منداڵــــدان دەکــــات و دەبێتــــە هــــۆی نــــەزۆکی. وە کاریگــــەری تریشــــی هەیــــە لەســــەر هــــەموو لاشــــەو جومگەکان.

٥. هــــەوکردنی پرۆســــتاتی تــــیژو درێژخایــــەن: ئــــەمیش تــــەنها توشــــی پیــــاوان دەبێــــت، چونکــــە پرۆســــتات لــــە نێرینــــەدا هەیــــە کــــە بریتیــــە لــــە پارچــــە گۆشــــتێك مــــاددەی مــــەنی دەردەدات و دەکەوێــــتە کۆتــــایی بــــۆری مــــیزەوەو دەوی داوە. جــــا ئــــەم هەوکردنــــە درێژخایەنــــە زۆرجــــار لای

گـــەنجان پەیـــدا دەبێـــت و ســـەرەنجام پرۆســـتات لـــەکار دەکـــــەوێت و بـــــۆری میـــــزی دەگیرێـــــت و پاشـــــان گورچیلـــەکان پـــەك دەخـــات. لـــە هۆکارەکـــانی ئـــەم نەخۆشیەش نێربازی و زیناو زۆر ئاوی خۆهێنانەوەیە.

جگە لە مانەش گەلێك نەخۆشی تر هەن وەك:

(کلامیـــدیا-هـــەوکردنـــی جگـــەری ڤایرۆســـی جـــۆری B– کاندیدا-..وە چەندانی تر)



# بەرنامەی ئیسلام بۆ خۆپاراستن لەداوێن پیسی

وەك وتـــــراوە خۆپاراســـــــتن لەچارەســــــەركردن باشـــــــترە. شـــەريعەتی ئيســـــلاميش لـــە هـــەنگاوی يەكەمـــەوە موســـڵمان دوور دەخاتـــــەوە لـــــەم بەڵا گەورەيـــــەو كۆمـــــەڵێك بنـــــەمای داناوە تا كۆمەڵگا دووربێت لە داوێن پيسی لەوانە:

١. ئيزن خواستن لەكاتی سەردان كردن و چاوگرتن.
٢. حـــەرام كردنـــی تەماشـــاكردنی مێردمنـــداڵ و بـــێ مـــو وە ئـــافرەت و داوێـــن و گۆڤـــاری پـــڕ لەوێنـــەی سێكســـی و (خيلاعی).
٣. نەوەســـتان و دانەنيشـــتن لـــە ســـەر جـــادەو ســـەرە رێگـــای خـــەڵكی مەگـــەر لـــەكاتی پێويســـتی و بـــە مـــەرجی تايبـــەتی خۆی.
٤. ئيسلام فەرمان دەكات بەخۆداپۆشين و باڵا پۆشی.
٥. ئيســـــلام عـــــەورەتی پيـــــاوو ئـــــافرەتی ديـــــاری كـــــردووەو سنوری داناوە بۆی.
٦. ئيســـلام نـــەهی دەكـــات كـــە ئـــافرەت دەنگـــی خـــۆی ناســـك بكاتەوە.
٧. ئيسلام تێكەڵاوی حەرام كردووە.

٨. حەرام کردنی مانەوە بە تەنها (خەڵوە) لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم دا (ئەگەرچی خزمیش بێت).
٩. حەرام کردنی تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم.
١٠. حەرام کردنی دەرچوونی ئافرەت لەماڵ بە عەترو بۆنی خۆشەوە.
١١. ئیسلام نەهی کردووە لە سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم یان چوونە دەر بەبێ ئیزنی پیاوەکەی.
١٢. نەهی کردن لە وەسف کردنی ئافرەت لەلای بێگانە.
١٣. جیاکردنەوەی پێخەفی نوستنی منداڵ دوای (دە) ساڵ.
١٤. حەرام کردنی گۆرانی ناشەرعی و مۆسیقاو زنجیرە فیلمە روخێنەرەکان کە کۆمەڵگا بێ رەوشت دەکەن.
١٥. هاندان بۆ زوو ژن هێنان لەکاتی تواناداا.. یان:
١٦. بە رۆژوو بوون بۆ کەسێك کە توانای ژن هێنانی نییە.
١٧. هاندانی باوك بۆ پەلە کردن لە بەشوودانی کچ و ژن هێنان بۆ کوڕی لەدوای باڵغ بونیاندا.
١٨. گرنگی دان بە پەروەردەی منداڵان.
١٩. زۆر دوور نەکەوتنەوەی پیاو لە خێزانەکەی بۆ ماوەیەکی درێژو زیاد لە چوار مانگ.
٢٠. لەسەرو هەموویەوە دروست کردنی ترسی خوای گەورە لەدڵ و دەروونی ئەندامانی کۆمەڵگادا..






ئــەی ئــەو کەســەی کەوتویتــە نــاو ئــەو گوناهــە گەورەیــە.. ئێســتا بــۆت روون بویــەوە چەنــدێك تاوانبــاو جینایــەتکاری؟! تــۆ لــە رزق و رۆزی و خــواردن و خواردنــەوەی خــوا دەخۆیــت.. هــەوای خــوای گــەورە هەڵــدەمژیت.. لەســەر زەوی و مــوڵکی خــوادا دەژیــت.. ئیــتر کــەی شــەرم دەتگرێــت و دەگەڕێیتــەوەو دەســت هەڵــدەگریت؟!. کــەی تەوبــە دەکــەیت و فرمێســکی پەشیمانی هەڵدەڕژیت و دەڵێیت:

ئەی نەفسی بەدکار بەسە تاکەی مەیلی دووری خوائەکەی

بەســە تــاکــەی بێ ئــەمــری خــواتــۆ لــە مــن داوا ئــەکــەی

خــەڵــکــی بــە نــەفــسی ســێــبــەری بــاخی بەهەشتی کڕی

تــۆش تــازە خــەریــکــی بــە مــن جــەهــەننــەم ئــاوا ئــەکــەی

ئــەو کەســەی زینــا دەکــات غیرەتــی مــردووە. ئــەو خــەریکی تێرکردنــی ئــارەزووی خۆیــەتی و ئاگــای لــە هاوســەرو خوشــکو دایکــی نــەماوە، ئــەم پشــتی کردۆتــە خێزانــی بۆیــە ئــەویش لەماڵــەوە گــوێ بــەخۆی نــادات بەڵام کــە دەردەچێتــە دەرەوە بــە هــەزار رەنــگ خــۆی دەڕازێنێتــەوە بــۆ خــەڵکی، بــە تــەنها لەگــەڵ شــۆفێرێکی بێگانــەدا دەڕوات، بــە تــەنها بــەناوی

چارەســـــەرەی خۆکردنـــــەوە دەچێتــــە لای دکتـــــۆرێکی بێگانـــــە. زۆر جـــاریش تووشـــی کەســـێکی نـــەفس نزمـــی شـــەرواڵ پیســـی وەك مێردەکـــەی دەبێـــت. لـــە ژێـــر نـــاوی (سەربەســـتی ئـــافرەت) چـــی بیـــەوێ دەیکـــات و مێردەکەشـــی نـــازانێ خـــەریکی چ ریســـواییەکە چونکـــە ئـــەویش نـــوقمی غەفڵـــەت و ئـــارەزوو بـــازی بووە.

ئـــاخر گونـــاهی کەســـێکی بـــێ ئاگـــا چییـــە کـــە خـــوێنی کەســـێکی تـــووش بـــووی تـــێ دەکـــەن و ئـــەویش گرفتـــار دەبێـــت!!! بـــێ گومـــان ئـــەو کەســـانەی هـــەڵگری ئـــەو نەخۆشـــییەن وەك بـــۆمبێکی چـــێنراو وان.. حـــەق وایـــە کۆمـــەڵگایان لـــێ پـــاك بکرێتـــەوەو فـــڕێ بدرێنـــە دەرەوەو، دیـــزە بەدەرخۆنـــە بکـــرێن تـــا گەرای بۆگەنیان خەڵکی نەزان و بێ ئاگا نەگرێتەوە.

دەئـــیتر بەســـە. بـــا لەخـــەو هەســـتین.. تاکـــەی دەبینـــە نێچیـــری داوی بەرنامـــەی دەســـتکردی ئـــاژەڵی و پشـــت دەکەینـــە رەوشـــتی بەرزی ئیسلامەتی و کوردایەتی.

بـــا هەســـتین تـــا دەردی ســـامناك و کوشـــندە یەخـــەی نـــەگرتووین و نـــەیکردووین بـــە پەنـــدو شـــەرمەزاری هـــەردوو دونیا.



## دەرەنجــام

موسڵمانی خۆشەویستی خۆگر..

ئەبێ حاڵی ئەم مرۆڤە تووش بووە چۆن بێت !!!

بیــر بکـــەرەوە ئەگەر(خواپـــەنامان بـــدات) ئـــەم وێنەیـــە وێنـــەی تـــۆ بێـــت وئـــاوا گرفتـــار ببیـــت ئـــەبێ ژیـــان چ مانایـــاکی هـــەبێت لەلات!!!...








## ئەم بانگەوازەش هەموومان دەگرێتەوە

حوزەیفەی کوڕی یەمان خوای لێ رازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی:

(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلَا يُسْتَجَابُ لَكُمْ)[1].

واتە: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە یان ئەوەتا فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، یان ئەگەر نا ئەوا نزیکە کە خوای گەورە سزایەکتان لە لایەن خۆیەوە بۆ بنێرێت و پاشان ئەگەر لێی بپاڕێنەوە وەڵامتان ناداتەوە.

ئەو کەسانەی کە شەوو رۆژ لە هەوڵی لاسایی کردنەوەی رۆژئاوادان با بزانن کۆمەڵگا بەرەو کوێ دەبەن.. کێ قازانج دەکات ئەگەر ئەو دەردانە تەشەنەیان کردو یەخەی گەنجەکانمانی گرت.با لە جیاتی لاسایی کردنەوەی لایەنە خراپەکانیان زانست و تەکنەلۆجیاکانیان بە دیاری بۆ ئەم گەلە بەش مەینەتە بهێنین نەك ئەم دەردە سامناکانە!! ئێمە وەك توانای کوون کردنی تەنها دەرزییەکمان نییە با کۆمەڵگاکەمان نەکەینە کێڵگەی ئەم هەموو ئافاتە.

---

[1] رواه أحمد وابن ماجه وسنده صحيح عند الترمذي على شرط البخاري ومسلم.

وە باگەنجـــە خۆگرەکانیشـــمان ئـــەو کەســـانە بناســـن کـــە کۆمـــەڵگا بـــەرەو ڕوخـــان دەبـــەن و نەکەونـــە نـــاو داوی جاڵجاڵۆکـــە ئاســـایان و خۆیـــان شـــەرمەزاری دنیـــاو ریســـوای قیامەت نەکەن .



# 

